**•هەندێ نەخۆشی دڵ و ماڵگی رەمەزان :**
١.نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن :
أ. دەتوانن بەرۆژوو بن .
ب. ئەوانەی رۆژی یەک ژەم دەرمان وەردەگرن، رۆژانە دەرمانەکە دوای بەربانگ وەربگرن و بەرۆژوو ببن .
ت. هەرچی ئەوانەن دەرمان بە دووژەم بەکاردێنن ئەوا دەتوانن هەمان دەرمان بەکاربێنن دوای بەربانگ و پێش پاشیو .
ث. ئەو نەخۆشانەی دەرمانی چارەسەرکردنی نەخۆشی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن وەردەگرن رۆژی سێ ژەم دەرمانەکە وەردەگرن پێویست دەکات سەردانی پزیشکی تایبەتمەند بکات .
٢. سینگەکوژێ ونۆرەی دڵ:
أ. ئەگەر لەناکاو بوو نابێت بەرۆژوو بین.
ب. بەڵام ئەوانەی ماوەیەکی زۆرە تووشی ئەو نەخۆشیانە بوونە دەتوانن بەرۆژوو بین دوای وەرگرتنی راوێژورێنمایی لە پزیشکی تایبەتمەند.
٣. پەککەوتنی دڵ:
بەگوێرەی حالەتی نەخۆشەکە پزیشکی تیبەتمەند بریاری لەسەردەدات .
٤.نەخۆشی زمانەکانی دڵ و تای رۆماتیزمی:
ئەگەر حالەتی نەخۆشەکە باشبوو دەبێت بەرۆژوو ببێت، ئەگەر تای رۆماتیزمی لەناکاو بوو ئەوا دەبێت بەرۆژوو نەبێت.
٥. نەشتەرگەری دڵ:
أ. دوای حەوت هەفتە دوای نەشتەرگەری دڵ بەرۆژوو نەبێت.
ب. ئەوانەی تووشی ماکی نەشتەرگەری یان نەخۆشیەکە بوونە ونەشتەرگەری دڵیان بۆکراوە تا ماوەیەکی زۆرتر بەرۆژوونەبن.
٦.ئەو نەخۆشانەی دەرمانی خوێن شلکردنەوە وەردەگرن : وەک ئەسپرین یان وارفارین دەتوانن بە رۆژووبن .

سەرچاوەکان :


١- Davidsons Principles & practice of Medicine، ٢٠١٠ .

٢- Harrisons principles of Internal Medicine، ١٧ th edition، ٢٠٠٨ .

٣- Current medical diagnosis & treatment، ٤٨ th edition، ٢٠٠٩ .

٤- The best guide to Alternative Medicine، Froemming، ١٩٩٨ .

٥- Braunwalds Heart disease، ٧ th edition، ٢٠٠٥ .




# کۆئەندامی هەرس

ئا: پزیشک

کۆئەندامی هەرس کە لە دەمەوە دەستپێدەکات وە بە دەرچە کۆتایی دێت، پێک دێت لە دەم و سورێنچک و گەدە و پەنکریاس و رژێنەکان و ریخۆلە گەورەو ریخۆلە باریکەو ریکە و کۆم و دەرچە، کۆئەندامی هەرس بەرپرسە لە هەرس کردنی خۆراک و دەرپەڕاندنی وزەی پێویست بۆ جی بە جێ کردنی زیندەچالاکییەکان، مانگی رەمەزان پەیوەندی راستەوخۆی بە کۆئەندامی هەرسەوە هەیە و بە مانگی حەوانەوەو خۆ نوێکردنەوەی کۆئەندامی هەرس دادەنرێت سەرەرای هەموو سوودە گشتیەکانی مانگی رەمەزان لەسەر جەستەی ئادەمیزاد، بەشیوەیەکی تایبەتی چەند سوودێکی بۆ کۆئەندامی هەرس هەیە، کە ئەمانەن:

١- بەرۆژوو بوون و نەخواردنی خۆراک وا دەکات کە رێژەی ترشەلۆکی ناو گەدە کەم بکات ئەمەش وەک یارمەتی بۆ کۆئەندامی هەرس لە ئەنجامی ئەو گۆرانانەی بەسەر لەش دادێت هەموو وادەکەن رووکەشە شانەکانی ناوپۆشی هەرس بەتین بن و بەهۆی ئەمەوە بەرگری دژی نەخۆشی زیاد دەبێت و تاکەکە نەخۆش ناکەوێت وە ئەگەر نەخۆشیش کەوت ئەوا زوو چاک دەبێتەوە.

٢- بەهۆی کەم خواردن و کەم بوونەوەی ژمارەی ژەمەکان هەلی گواستنەوەی ئەو نەخۆشیانەی بەریگای دەم و دەست بلاودەبنەوە کەم دەبنەوە.

٣- رۆژووی مانگی رەمەزان وەک چارەسەر بۆ نەخۆشیەکانی کۆئەندامی هەرس کە لەئەنجامی خراپی دەروونی و گرژی و دەروونی توشی ئادەمیزاد دەبێت وەک نەخۆشییەکانی : قولۆن، و نەخۆشیەکانی نارەوانی (قەبزی) وە نەخۆشی دل تێکهەلاتن (عسر التهضم) .

٤- کەمتر کرم و مشەخۆرەکان بلاودەبنەوە.

٥- رۆژووی مانگی رەمەزان وەک ریگایەکی خۆپاراستنە لە توش بوون بە شێرپەنجەی ریخۆلەو گەدە چونکە بینراوە ئەوانەی کە بەرۆژوو دەبن کەمتر توشی نەخۆشی شێرپەنجەی گەدەو ریخۆلە دێن لەوانەی کە بەرۆژوو نابن .

**• رێنمایی گشتی بۆ ساغ راگرتنی کۆئەندامی هەرس لەکاتی بەرۆژوو بوون دا:**

١-ئەگەر نینۆکت هەبوو ئەوا یەکسەر نینۆکەکانت قووت بکە لەبەر ئەوەی نینۆک یارمەتی دەرە لە گواستنەوەی زۆربەی نەخۆشیەکان و هەرکەسی نینۆکی درێژ بێت ئەوا تەندروستی باش نابێت .

٢- گرنگی بە پاک و خاوێنی دەم و ددان و ناو دەمت بدەو بەردەوام سیواک بکە یان بە فلچە بیشۆ یان ئەگەر هەرنەکرا کاتی دوای نان خواردن و دەست شۆردن هەندێ ئاو بکەرە ناو دەمت و غەرغەرەی پێ بکە.

٣- دووربکەرەوە لە جگەرە کیشان و هەولبدە واز لە جگەرە کیشان بهێنیت.




٤- خواردن و خۆراک چاک بجوو وە لەسەر توورەبوون و قسەکردن نان مەخۆ .

٥- دووربکەرەوە لە خواردنی خۆراکی چەورو قورس لەبەرئەوەی ئەم جۆرە خۆراکانە قرپ و غازاتت بۆ دروست دەکەن، ئیمەش دەزانین کە دڵتێکهەڵاتن و قرپ و غازات نیشانەیەکی زۆر باوەو خەلکێکی زۆر ئەم نیشانانەیان هەیە، تاکەکە هەست بەسک ئیشەو بوونی غازات و قرپ جار جار هێلنج دەکات، ئەم نیشانانە چەند هۆیەک هەیە کە دروستیان دەکات :

a) نارەحەتی و نا ئارامی دەروونی
b) هەوکردنی سورێنچک
c) برینی گەدە و دوانزە گرێ
d) کرم و مشەخۆرەکان

زۆر لەوانەی بەرۆژوو بوون چاک دەبن بەمەرجێ لە خواردنی خۆراکی چەورو قورس بە دووربن .

٦- زۆرانێک لە ئیمە وا راهاتوون کە پارووە نانێک دەخۆن و پەرداخە ئاوێک دەخۆنەوە، وا باشە بەتایبەتی ئەوانەی هەوکردنی سورێنچکیان هەیە واز لەو راهاتنە بێنن خواردنەکە تەواو بخۆ ئینجا تێر ئاو بخۆرەوە .

٧- بۆ ئافرەتان بەتایبەتی ئەگەر کەم خوێن بوون دوای نان خواردن یەکسەر چا مەخۆرەوە، چونکە چا مژینی ماددەی ئاسن لەناو ریخۆڵە کەمدەکاتەوە کەم خوێنیەکەت زیاتر دەکات .

٨- خۆراک چەند خۆراکەکە سادە بێت باشەو پێویست ناکات زۆر گران بێت و یا لەهەموو جۆرێک بێت .

٩- زۆر خواردنی سەوزەو میوە دوای بەربانگ .

١٠- بەربانگکردن بە قەسپ یان خورما یان ئاو
١١- زۆر خواردنی ئاوو شەربەت
١٢- دوورکەوتنەوە لە خواردنەوەی شلە گازدارەکان وەک بیبسی و سیڤن و .........هتد

**• نەخواردنی خۆراک (بەرۆژوو بوون): G.secretion**

١- وەک یارمەتی بۆ کۆئەندامی هەرس لە ئەنجامی ئەو گۆرانانەی بەسەر لەش دادێت رووکەشە شانەکانی ناوپۆشی هەرس بەتین دەکات.
٢-بەهۆی کەم خواردن:- هەلی گواستنەوەی ئەو نەخۆشانەیەی بەریگای دەم و دەست بلاودەبنەوە،کەم دەبێتەوە:
٣- وەک چارەسەر بۆ نەخۆشیەکانی وەک نەخۆشی یەکانی قولۆن و نەخۆشی یەکانی قەبزی (امساک) و نەخۆشی عسر التهضم
٤- کەمتر کرم و مشەخۆرەکان بلاودەبێتەوە
٥- وەک رێگایەکی خۆپاراستن لە شێرپەنجەی ریخۆلەو گەدە، چونکە بینراوە ئەوانەی کە بەرۆژوو دەبن کەمتر تووشی نەخۆشی و شێرپەنجەی گەدەو ریخۆلە دێت لەوانەی کە بەرۆژوو نابن

**• نەخۆشی یەکانی کۆئەندامی هەرس :-**

أ- دل تێکهەلان و قرپ و غازات (عسر التهضم) :-
نیشانەیەکی زۆر باوە، خەلکیکی زۆر ئەم نیشانانەیان هەیە، نەخۆش هەست بەسک ئیشەو بوونی غازات و قرپ جارجار هێلنج دەکات، چەند هۆیەک هەیە :
١- نارحەتی و نائارامی دەروونی
٢- برینی گەدەو دوانزە گرێ
٣- زۆر لەوانە بە بەرۆژوو بوون چاک دەبن
٤- بەمەرجێ لە خواردنی خۆراکی چەورو قورس دووربکەونەوە
٥- جگەرە نەکیشن
٦- خواردنی چاک بجوو
٧- لەسەر توورەبوون و قسەکردن نان مەخۆ
٨- ئەگەر ئەو عادەتەت هەبوو پارە نانەک پەرداخەک ئاو، نانەکە بخۆ ئینجا ئاو بخۆ
٩- ئافرەتان بەتایبەتی ئەوانەی کەم خوێنن دوای نان خواردن یەکسەر ئاو مەخۆرەوە
ب-برینی گەدەو دوانزە گرێ :-
ئەو برینەیە کە لەگەدە یان دوانزە گرێ دێ، لەوانەیە لەناکاو یان درێژخایەن بیت نزیکەی ١٠٪ دانیشتوان ئەم جۆرە نەخۆشی یەی هەیە بەزۆری لە پیاوان هەیە هۆیەکەی
١- بەکتریای H.pylori
٢- خواردنی دەرمانی مسکن

نیشانەکانی:
١- بە پەنجەیەک دەلی سەر دلّم دیشێت
٢- بەزۆری بە برسیتی دیشێت
٣- بەتایبەتی لە شەودا نەخۆش خەبەری دەبێتەوە، شیر یان نان یان بسکویت دەخوات و ژانەکەی نامینێت
٤- ژانەکە ناوە ناوە دێت (لەماوەی نیوان دوو ژاندا زۆر سەلامەتە)
٥- نیشانەکانی وەک:-
أ-شەهیەی نیە (تەبحاتی خواردن نابات)
ب- ئاوم لە دری دێ
ت- دلەکزە وەیان رشانەوەی هەیە
دیاری کردنی:
ناظور المعده یان Barrium meal
چارەسەر کردنی:/
دەرمانی دژی تووش بوونی گەدەو

دوانزه گرێ
جا ئەوانەی کە برینی گەدە یان دوانزە گرێ یان هەبێت، ئەوا لەبەر ئەوەی ئەگەر بەرۆژوو بن ئەوا لە رۆژدا ریژەی ترشەلۆکی گەدە کەم دەبێت وە لەکاتی بەربانگ کردن دەبێتە هۆی زیاد دەردانی ترشی گەدە و بەمەش لەوانەیە نەخۆشەکە تووشی خوێن بەربوون بێت جا واباشە ئەوانەی نەخۆشی کولکی گەدە یان دوانزە گرێ یان هەیە (جۆری لە ناکاوە ) با بەرۆژوو نەبن چونکە زیانی هەیە بۆ سەریان .
بەلام ئەوانەی کە قرحەی دوانزەگرێ ی درێژخایەنیان هەیە لەسەر دەرمانی قرحەن ئەوا دەتوانن دەرمانەکانیان وەربگرن لەگەل بەربانگ وە بەرۆژوو بیت لەکاتی مانگی رەمەزان وەک هاندەریک بەلام لە هەموو باریک دا بریاردان ئایا کاوەیان بەرۆژوو بێت کاوە بەرۆژوو نەبێت دەگەرێتەوە بۆ پزیشکی چارەسەر کەر
ئەگەر قرحەت هەبوو بەرۆژوو بی لەم حالەتانە رۆژووەکە بشکێنە :
١- ژانە سک لەکاتی برسیەتی
٢- شەو لەخەو هەلسان لە بەر ژان
٣- خوێن بەربوون لە برینی گەدەو

**• نەخۆشی سک چوون :/**

سک چوون / دوو جۆری هەیە :-
١- سک چوونی لەناکاو / ئەویش ئەو سک چوونەیە کەلەناو دەست پێدەکات لەوانەیە چەند سەعاتێک یان چەند رۆژێک بخایەنێت .
هۆیەکەی / أ- هەوکردنی گەدەیە
ت- هەوکردنی ریخۆلە

٢- سک چوونی درێژخایەن /ئەو سک چوونەیە کە ماوەیەکی درێژ دەخایەنی و ناوە ناوە سک چوون روودەدات
هۆیەکەی / ١- التهاب قولون
٣- تهیج قولون
٤- زەحیری ئەمیبی
سک چوون دەبێتە هۆی
١- داهیزران و بی تاقەتی
٢- لەدەست دانی شلەمەنی لەش
٣- سک چوون مەترسی دار دەبێت ئەگەر چارەسەر نەکرێت، وە لەوانە بە نەخۆشی پیویستی بە مغزی هەبێت کە لەریگەی خوینهێنەرەکانەوە دەبینین بەتایبەتی ئەگەر سک چوونەکە زۆر بە توندی بوو جا واباشە ئەوکەسەی سک چوونی هەیە بەتایبەتی سک چوونی زۆر ئەوا بەرۆژوو نەبی وەک لە ژیر رۆشنایی ئەو فەرمودە پیرۆزە (لاضرر و لا ضرار)
٤- نەخۆشیەکانی جگەر
١- ئەو کەسەی تووشی نەخۆشی cirrhosis تلف الکبد بووە با بەرۆژوو نەبێت
٢- ئەو کەسەی التهاب الکبد الفایروس هەیە واتە زەرتک لەبەر ئەوەی پیویستی بەبری چاکی خواردن هەیە واباشە بەرۆژوو نەبێت
٥- بەردی زراو:
کاریگەری بەرۆژوو بوون لەسەر بەردی زراو جیاوازە، هەیانە لەکاتی بەرۆژوو بوون باش دەبن، هەشیانە ژانەکەی زۆر دەبێت
پیویستە نەخۆشەکە راوێژی پزیشکی موسلمان وەربگرێت ئینجا بەرۆژوو بێت بەلام بەزۆری دەتوانن بەرۆژوو بن
٦- نەخۆشی فتق سەردڵ/ فتق المعدە
٧- بەتایبەتی لەوانە زۆرن کە قەلەون ( بەتایبەتی لە ئافرەتانەوە کە تەمەنیان لە سەرووی ٤٠ سالیەوە ) یان بەتایبەتی جگەرە کیشن یان هەیە هەر لەمندالیەوە

هەیەتی.
نیشانەکان/
دلە کزەو خواردن گەرانەوەو بۆ ناو دەم لەکاتی خۆ خوارکردنەوە
چارەسەر/
١- خۆ لاواز کردن
٣- واز لە جگەرە کیشان بهێنێت
٤- دەرمان ترشەلۆکی گەدە (وەک زانتاک)
٥- خواردنی ژەمی بچووک بخورێت و چاک بجورێت
٦- دەرمان بەرێکی بەکاربێت





# نەخۆشی شەکرە

ئا: پزیشک

بریتی یە لە دیاردەی زیادبوونی ڕێژەی شەکر لە خوێندا لە ئەنجامی نەبوونی یان کەم دەردانی یان کارنەکردنی هۆرمۆنی ئەنسولین هۆرمونێکی مالداریکە لەلایەن رژێنی پەنکریاس دەڕژێ، دەست دەگرێ بەسەر هەموو پێکهێنە کردارەکانی لەش وە نەبوونی دەبێتە نەخۆشی شەکرە (داء السکر) نەخۆشی شەکرە ئیستا بە هۆیەکی زۆر گرنگی پەککەوتنی گورچیلە و کوێربوون و بڕینەوەی قاچ دادەنرێ، وە رێکخراوی تەندروستی جیهانی WHO هۆشداری ئەوەی داوە کە سالی ٢٠١٠ نزیکەی ٢٢٠ ملیۆن کەس لە دونیادا نەخوشی شەکرەیان دەبێت و وە ڕوو لە زیاد بوونە بە تایبەتی ئەو جۆرەی کە لەسەر حەبەو لە تەمەنی درەنگ تووشی مرۆڤ دەبێت.
جا بابزانین ئەو کەسەی نەخوشی شەکرەی هەبێت بە ڕۆژوو ببێت وە چۆن ؟

سوودەکانی بە ڕۆژوو بوو لەسەر نەخۆشی شەک:

١- کۆنترۆلکردنی ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا لەمانگی رەمەزان.

١- کۆنترۆلکردنی فشاری خوێن.

٢- کۆنترۆلکردن و دابەزینی ئاستی ڕیژەی چەوری ناو خوێن.

٣- دابەزینی کێشی لەش بە ڕێژەی نزیکەی ٣,٥KG بەم جۆرە کاری پزیشک بریتی یە لە:

ئایا ئەو کەسەی نەخۆشی شەکرەی هەیە بەڕۆژوو بێ؟

ب- ئایا رۆژووەکەی بێ زەرەرە.

بۆ وەلام دانەوەی ئەم دوو پرسیارە ئەم خالانەی خوارەوە ڕووندەکەینەوە:



**• ئەو فاکتەرانەی پێش ڕەمەزان پێویستە لەبەر چاو بگیرێ، ئەمانەن:**

١- دڵنیابوون لەبارێ تەندروستی نەخۆش و ئایا ڕێژەی شەکرەکەی چاک کۆنترۆل بووە.

٢- ڕێکخستنی هەردووک خواردن و دەرمان لەمانگی ڕەمەزان دا.

٣- نەخۆشەکە بتوانێ هەموو ئیش و کارەکانی بەتەواوی جێبەجێ بکات.

٤- زانینی نیشانەکانی وەک:

أ – وشکبوونەوە: زۆر تێنوو بوون، دەم ووشکبوون و هیلاکی و داهێزران.

ب- کەمبوونی شەکر و دابەزینی شەکر: داهێزران، بێ تاقەتی، گێژبوون، زۆر ماندوبوون و ئارەقە کردن، دڵە کوتێ سەر سووران لەوانەیە بگاتە بوورانەوە.

* هەڵبژاردنی ئەو نەخۆشانەی کە ڕێگا بدرێ بە ڕۆژوو بین:

١- هەموو ئەو نەخۆشانەی لە هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ کە تەمەنیان لە ٢٠ ساڵ زیاترەو ڕێژەی شەکریان ئاساییە یان نزیک بە ئاساییە.

٢- نەبوونی نەخۆشی تر لەگەڵ شەکر: وەک، فشاری خوێنی زۆرە severe hypertention نەخۆشی دڵ، نەخۆشی جگەر و گورچیلە.

٣- ئافرەتی شیردەر و دووگیان نەبێت و تەندروستی باش بێت و نەخۆشی شەکرەی هەبێت.

٤- ئەو نەخۆشانەی کە لەسەر دەرزی ئەنسۆلین تا دەکرێ بە ڕۆژوو نەبن .

* خۆراکی مانگی ڕەمەزان ئەو کەسانەی کە نە خۆشی شەکرەیان هەیە و مانگی ڕەمەزان بەرۆژوو دەبن.

وا باشە خواردنەکەیان بەم شێوەیەی خوارەوە بێت:

١- ڕێگە نەدرێ کە خواردنی وزەی زۆر چەو رو گران و خواردنی سوورکراوە بخورێت.

٢- پارشێو با خواردنێکی فایبەری زۆر بێ کە ماوەی ٨-٦ سەعات بخایەنێ.

٣- بەربانگ: با نیشاستەی CHO ئالۆزی کەم تێدابێ چونکە لەش پێویستی بە زیادبوونی شێوەیەکی چاک لە شەکرە هەیە.

٤- پێویستە خواردن هاوسەنگ بێت و هەموو جۆرە خۆراکێک هەبێت وەک بەرهەمی شیر و گەنم و سەوزەو میوە.

٥- موسلمان قەسپ و خورما بەکاردێنێ، باشترە دووربن لە خواردنی خورما.

٦- ئاو و شلەمەنی زۆر بخورێت بەتایبەتی ئاو و شەربەتی بێ شەکر.

٧- باشترە سەوزەو میوە زۆر بخورێ بۆ کەمکردنەوەی ماکەکان.

٨- وا باشە لە دوو هەفتەی پێش ڕەمەزانەوە دەست بکرێت بە نەخواردنی قاوەو کەمکردنەوەی چایی و جگەرە نەکێشان.

٩- هەڵبژاردنی دەرمان، سەردانی پزیشکی تایبەتمەند بکات و پزیشکەکە بە گوێرەی ڕێنماییەکان دەرمانی پێویستی بۆ ڕێکدەخات.

• ماکەکانی کە تاکێک نەخۆشی شەکرەی هەبێت و بریاریدا بەرۆژوو بێت دەتوانرێ بکرێت بەمانە:

١- زیادبوونی ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا.

٢- دابەزینی ڕێژەی شەکر لەناو خوێن دا کە نیشانەی وەک: داهێزران، بێ تاقەتی، گێژ بوون، زۆر ماندو بوون، ئارەقەکردن و دڵە کوتێ، لەوانەیە بگاتە بوورانەوەو لە خۆچوون.

٣- ماکی دیکە وەک، وشکبونەوە، Dehydration کەنیشانەی وەک زۆر تێربوون و دەم وشکبوون و هیلاکی clecramp سەر ئێشە Hedache یان غازات flatulence یان دڵتێکهەلاتن Dyspesia یان ناردوانی constipation یان برینی

گەدە، پێویستە پزیشک ڕێنمایی تایبەت و نیشانەکانی ئەو ماکانە بۆ تاکی نەخۆش روونبکاتەوە و نەخۆشەکە کاتێک بەرۆژوو بوو هەرنیشانەیەکی لە نیشانەکانی ئەو ماکانە تێبینی کرد ئەوا بە گوێرەی ڕێنمایی پزیشک بجولێتەوە.

جا بۆ تێگەیشتنی نەخۆشی شەکرە لەمانگی رەمەزان و دانی ڕێنمایی پێویست، نەخۆشی شەکرە دەکرێ بەو کۆمەلانەی خوارەوە:

١- شەکرەی ناراستەقینە: بەزمانی میللی شەکرەی درۆزنی پێدەگوترێت، بریتییە لەو جۆرانەی کە لەئەنجامی توشبوون بە نەخۆشیەک یان بەهۆی بەکارهێنانی هەندێ ماددە یان دەرمان وەک دەرمانە سترۆیدیەکان بە شێوەیەکی کاتی ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا بەرز دەبێتەوە و بەراگرتنی ئەو دەرمانە یان ئەو ماددەیە وردە وردە ڕێژەکە ئاسایی دەبێتەوە، ئەم گرووپە رۆژووی مانگی رەمەزان باشترین چارەسەر و هەلە بۆیان پێویستە بەرۆژوو بن و لە دەستی نەدەن و لە ئایندەدا لە بەکارهێنانی ئەو جۆرە دەرمانانە بە دوور بن.

٢- شەکرەی راستەقینە: ئەم جۆرە بە گوێرەی ئەو چارەسەرەی کە پزیشک بۆی دەنوسێت دەکرێت بە سێ جۆرەوە، کە ئەمانەن:

یەکەم: ئەوانەی کە لەسەر پارێزن.

دەرمان بۆ چارەسەر وەرناگرن، بەڵام ڕێژەی شەکرەکەیان بەرزە، ئەو نەخۆشانە چارەسەریان بە پارێزیکردنە، ئەو جۆرە نەخۆشانە رۆژووی مانگی رەمەزان هەلێکی زێرینە بۆ کۆنترۆلکردن و چارەسەرکردنی نەخۆشی شەکرەکەیان، ئەوانەی کە لەسەر پارێزن ئەو ڕێنماییانەی خوارەوە جێ بەجێ بکەن.

١- چ جۆرە خواردنێک و چەندت دەخوارد پێش رەمەزان هەمان بڕ بخۆ واتا پارێزیکردنەکە تێک مەدە

٢- هوڵبدە ئەو برە خواردنە بکە بە سێ بەشەوە:

a) بەشێک لەگەل رۆژوو شکاندن .

b) بەشێک دوای نوێژی شێوان (تەراویح).

c) بەشێک بۆ پارشێو .

٣- وا باشە ژەمی پارشیو تا بکرێ دوا بخرێ.

٤- کارو باری رۆژانەت بە جوانی جێبەجێ بکە، دوای نیوەرۆ کەمێک ئیسراحەت بکە دەتوانی بخەوی.

٥- پێویستە ئەوە بزانی زۆر خواردنی رەمەزان بەتایبەتی ئەوانەی شیرینیان تێدایە وەک پاقلاوە بە سوودی تۆ نیە.

٦- ئەگەر بە گوێرەی ئەو ڕێنماییانە بە رۆژوو ببیت ئەوا شەکرەکەت کۆنترۆل دەبێت کێشی لەشت دادەبەزێ.

دووەم : ئەوانەی دەرمان بەکاردێنن.

ئەوانەی کە بۆ چارەسەری نەخۆشی شەکرە، حەبی شەکرە بەکاردێنن ئەمانە دەتوانن بەرۆژوو ببن بەلام ئەم ڕێنماییانە پەیرەو بکەن:

١-ئەگەر یەک ژەم حەبی شەکرە بەکاردەهێنا، هەمان ژەم بەکار بێنە بەلام پێش بەربانگ .

٢- ئەگەر دوو ژەم حەبی بەکار دەهێنا، ئەوا واباشە ژەمی سبەینان لە پێش بەربانگ و پێش پارشیو نیوەی ژەمی ئێوارە واتا نیو حەب.

٣- لە هەموو کاتێک دا پێویستە ڕێنمایی پزیشکی خۆت وەربگریت.

٤- کۆنترۆلکردنی شەکر بە ماوەی دوو مانگ پێش رەمەزان بە جۆری Hb A١c ببێ بە کەمتر لە ٨.

٥- ئەگەر حەبی metformin ت بەکاردێنا ئەوا یەک هەفتە پێش رەمەزان رایبگرە .

٦- دەرمانی زۆر درێژ خایەن پاش



وەرگرتنی ڕینمایی، پزیشکی تایبەتمەندت با بۆت بگۆڕیت.
٧- خواردنی تایبەت بە نەخۆشی شەکرد لە بەربانگ و پارشیو بەکاربینە.
سێیەم : ئەوانەی لەسەر دەرزین
ئەوانەی کە دەرزی بەکاردینن دەبێت بەم شێوەیە ڕینمایی وەربگرن:
١- ڕینمایی پزیشکیکی موسلمان وەربگرە.
٢- ئەگەر ئەنسولین بە تیکەلاوی بە ڕێژەی ٧٠\٣٠ یان ٧٥\٢٥ ڕابگرە .
٣- ئەگەر لەسەر ئەنسولنی شیلوو بووی، ژەمی ئەنسولین ٪٢٠ کەمبکەوە ئینجا ٣\٢ لەبەربانگ وەربگرەو ٣\١ لە پارشیو .
٤- ئەنسولین سافی (ڕوون) ٦-٤ یەکە وەربگرە لە پیش بەربانگ و پارشیو.
٥- ئەم ژەمانەی لە ژێر چاودیری پزیشک گۆرانی بەسەر دادیت و ڕیگا نادریت هیچ کەسیک بەبی ڕاویژی پزیشکی پسپور لە ژەمی ئەنسولینەکان و جوریان دابکات .
٦- ئەگەر ئەنسولینت وەردەگرت لە ٤٠ یەکە کەمتر بوو دەتوانیت بەرۆژوو ببیت بەتایبەتی ئەگەر بەیەکجار وەرتگرت، بەلام ئەگەر لە ٤٠ یەکە زیاتر بوو ئەوا واچاکە بەرۆژوو نەبیت.

**• ڕینمایی گشتی**

ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە و دەیانەویت بەرۆژوو بن:
١- پشکنینی شەکر پاش بەربانگ و پیش پارشیو بکە.
٢- ئەگەر هەستت بە نارحەتی و خراپی کرد پشکنینی شەکر بکە.
٣- ئەگەر شەکرەکەت لە ٦٠mg\ldg هاتبووە خوارەوە ئەوا ڕۆژووەکەت کۆتا پی بینە و ئەگەر لە ٤٠٠mg\dl زیاتر بوو ئەوا دووبارە ڕۆژووەکەت بە کوتا بینە.
٤- پیش بەربانگ وەرزش مەکە و خۆت ماندومەکە.
٥- ئاو زور بخورەوەو شەربەتی بی شەکر زور بخورەوە.
٦- لە مانگی ڕەمەزان هەر هەفتەی جاریک سەر لە پزیشکت بدە.

# نەخۆشی گورچیلە

ئا: پزیشک

هەموو مرۆڤێک دوو گورچیلەی هەیە، کێشی هەر گورچیلەیەک لە نێوان ١٤٠-١٣٠ غم وە درێژیەکەی ١٤-١١ سم دەبێت قەبارەکەی لە مشتی مرۆڤ بچوکترە، وە خوای گەورە گورچیلەی وا دروست کردوە کە دەتوانێ رۆژێ (٢٤) سەعات لە نێوان ٨٠٠ مل تا ٢٥٠٠ مل میز لە ٢٤ کاتژمیردا بکات.

**فەرمانەکانی گورچیلە بریتیە لە:**

١- دەردان: دەردانی پاشماوەی پێکهێنە کردارەکان و دەرمان و هەموو پاشماوەکانی تر.

٢- ڕێکخستن: ڕێکخستنی قەبارەو ناوەرۆکی شلەی لەش و پاراستنی هاوسەنگی ترش و تفتی.

٣- هۆرمۆنی دەردان: دەردانی هۆرمۆنی ئێترپروپوتین ڕینین وە پرۆستاگلاندین کە ئەم هۆرمۆنانە دەورێکی زۆریان لەسەر جەستەی ئادەمیزاد هەیەو لەکاتی کەمبونیان یان نەبوونیان مرۆڤ توشی چەندەها نەخۆشی دەکەن.

٤- دروست کردنی ڤیتامین D کە بوونی پێویستە لە لەشداو جەستەی ئادەمیزاد پتەو دەکات.

• کاردانەوەی بە ڕۆژووبوون لەسەر گورچیلە:

لە کۆندا بروا وابوو کە بەڕۆژووبوون کاردانەوەی خراپی لەسەر گورچیلەکان هەیە، لەبەر ئەوەی لەکاتی بەڕۆژووبووندا مرۆڤ توشی ووشک بونەوەیەکی کەم دەبێت کە لەناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر پلەی ئەم ووشک بوونەوەیە دەگۆرێ زۆر یان کەم بە گوێرەی پلەی گەرما وەتاکی بەرۆژوو بوو، هەست بە تینووبوون و دەم وشک بوون دەکات، بەڵام ئێستا لە زانستی پزیشکی نوێدا ئەوە سەلمێنرا کە ئەم بیروباوەرە بە تەواوی هەڵەیە بەڵکو مانگی رەمەزان سوودی زۆری بۆ کۆئەندامی دەردان لەوانەش (گورچیلەکان) هەیە و بەرۆژووبوون یارمەتی چالاک بوونیان دەدات و وادەکات کاروفەرمانەکانی زۆر بە چاکی جێ بەجێ بکات، تەنانەت لە هەندێ باردا وەک (چارەسەرکردنە) بۆ هەندێ نەخۆشی گورچیلەکان وە لەهەندێ باردا وەک (خۆپاراستنە) لە تووشبوون بە نەخۆشیەکانی گورچیلە.

بەڕۆژووبوون کاردانەوەی لەسەر گورچیلە دەبێت، بەم شێوەیە:

١- قەبارەی میزکردن هیچ گۆرانێکی بەسەر دانایەت.

٢- ئۆزمۆلالیتی و دەردانی توخم و ئەلەکترۆلیتەکان وەکو خۆی دەمێنێ و گۆرانی بەسەر دانایەت.

٣- کەمێک یوریا (BUN) زیاد دەبێت وە ئەم زیاد بوونی یۆریایە زۆر گرنگ نی یە ئەگەر هاتوو تاکی بەرۆژووبوو لە نێوان بەربانگ و پارشیو زۆر ئاو و شلەمەنی و میوەجات بخوات.

٤- کەمێک خوێی یوریک ئەسید Uric




acid زیاد دەبێت و وە بەگوێرەی ڕێژەی گۆشت خواردن ئەو زیاد بوونە دەگۆڕێ، بەڵام لە هەموو بارەکان دا ئەو زیاد بوونە لە یۆریک ئەسید نابێتە هۆی ئەوەی نەخۆشی دروست بکات وە ئەگەر تاکی بەڕۆژوو بوو دوای بەربانگ ئاو و شلەمەنی زۆر بخواتەوە ئەوا ئەو زیادبوونە کەم دەکاتەوە.

**• هەندێ نەخۆشی گورچیلە:**

أ/ پەککەوتنی گورچیلە (عجز الکلیە):
پەککەوتنی گورچیلەکان (درێژخایەن یان لە ناکاو) هەردوو گورچیلە بەهۆی چەندەها هۆکار ناتوانن کارو فەرمانەکانیان بە تەواوی جێبەجێ بکەن و تووشی پەککەوتن دەبن و بڕی میزکردن کەم دەبێت، وە بەگوێرەی کاتی ڕوودانیان دەکرێت بە دوو جۆرەوە.

١- پەککەوتنی گورچیلەکانی لەناکاو:
لەناکاو گورچیلەکان لەکار دەکەون و ڕێژەی یۆریا کریاتنین پشکنینی ئیشی گورچیلەکان زیاد دەکات و نەخۆش کەم میز دەکات و ڕشانەوەو وشک بوونەوە و دابەزینی فشاری خوێن و بوورانەوەی دەبێت هۆیەکەی:

a) گشتی Prerenal وەک سوتان و خوێن بەربوونی زۆر.

b) گورچیلە: هەندێ نەخۆشی گورچیلە و بەکارهێنانی هەندێ دەرمان.

c) پاش گورچیلە (postrenal): وەك گیرانی هەردوو بۆری میز بەهۆی بەردەوە یان بەهۆی گرێ یەوە (شێرپەنجە).

• ئەوانەی کە توشی پەککەوتنی گورچیلەی لەناکاو بوونە دەتوانن بە ڕۆژوو نەبن لەبەرئەوەی مەترسی لەسەر ژیانیان دروست دەکات.

d) پەککەوتنی گورچیلەی درێژخایەن

ئەوانەن کەماوەیەکی زورە نەخوشی پەککەوتنی گورچیلەیان هەیە و هەندیکیان لە سەنتەری گورچیلە فایلی تایبەتیان هەیە و کەم خوینن و رەنگی پیست دیارەو فشاری خوینیان بەرزەو بە سونار گورچیلەکانیان بچوکە، بەگویرەی چارەسەرکردنیان چەند قوناغیکیان هەیە و هەندیکیان لەسەر دەرمانن ئەوانە دەبی سەردانی پزیشکی تایبەتمەندی خویان بکەن و پزیشک بریار بدات ئایا بەروژوو بیت یان نەبیت.

هەرچی ئەو نەخوشانەن کە گورچیلەیان بەتەواوی لەکار کەوتوون و دەبی شوشتنی گورچیلەیان بو بکری، جا ئەوانە یان شوشتنەکە بەریگای سوندەی سك peritonial dialysis یان بەریگای خوین Haemodialysis دەبیت ئەو روژانەی ئەو نەخوشانە شوشتنی گورچیلەیان بو دەکریت یان بەروژوونەبن بەلام لەو روژانەی کە شوردنی گورچیلە (غسل الكليه) یان بو ناکری دەتوانن بەروژوو بن گومان لەوەدانیە دوای وەرگرتنی رای پزیشکی پسپور.

ب/ هەوکردنی گورچیلە (UTI)

هەوکردن نەخوشیەکی زور بلاوە وە بەتایبەتی لە ئافرەتاندا زوربەی ئافرەتان بەلایەنی لە ژیانیان دا تووشی هەوکردن بوون بەتایبەتی لەئافرەتان لەکاتی دووگیانیدا یان نەخوشی شەکرەی هەبیت یان لە ئافرەتان دوای مندال بوون یان ئەوانەی تازە بووک و زاوان، لە پیران و منداڵاندا روودەدات.

**هۆیەکانی تووشبوون بە هەوکردن:**

١ بەردی گورچیلە.

٢) نەخوشیە زگماکیەکانی گورچیلە.

٣) نەخوشیە زگماکیەکانی درکەپەتک

٤) بوونی هەوکردن لە ناوچەی کوئەندامی زاوزی

ه) ئەوانەی نەخوشی شەکردیان هەیە

ئەو نەخوشانەی کەهەوکردنی گورچیلەیان هەیە پیویستیان بە خواردنەوەی ئاوی زور هەیە و پیویستیان بە دەرمان دەبیت و دەبی چون دەرمانەکانیان بو نووسراوە ئاوا بخوریت و رینمایی دەکریت کە لەنیوان بەربانگ و پارشیو زور ئاو و شەربەت و شلەمەنی زور بخونەوە، وە لە زوربەی کاتدا دەتوانن بەروژوو بن، هەرچی ئەوانەی کە لەگەل هەوکردنی گورچیلەکانن تووشی ئالوسکەکانی هەوکردن بوونە ئەوا پیویستە راویژی پزیشکی پسپور وەربگرن و بەگویرەی باری تەندروستی نەخوشەکە پزیشکەکە بریار دەدات ئایا نەخوشەکە بەروژوو بیت یان نەبیت.

ج/هەوکردنی میزلدان و هەوکردنی میزەرو و هەوکردنی پروستات ئەو نەخوشانەی کە ئەم جورە هەوکردنە (التهاب) یان هەیە پیویستیان بە خواردنەوەی ئاوی زور هەیە، جا لەبەر ئەوە رینمایی دەکریت کە لە نیوان بەربانگ و پارشیو زور ئاو و شەربەت و شلەمەنی بخونەوە و دووربن لە خواردنەوەی شلە گازدارەکان (وەک پیپسی)وە لە زوربەی کاتدا دەتوانن بەروژوو ببن.

د/ بەردی گورچیلە (renal Stone)

بەردی گورچیلە بریتیە لە کوبوونەوەی کریستال و ماددەی پروتین و گلایکو پروتین وە هوی دروست بوونی تا ئیستا بەتەواوی نەزانراوە، بوچی لەهەندیک کەس روودەدات و لەهەندیکی تر روونادات ؟ بەلام ئەوە گومانی تیدا نیە کە هوکاری بوماوەیی و هوکاری دەوروبەر بەیەکەوە دەوردەبینن لە تووش بوون بە بەردی گورچیلە، بەردی گورچیلە لەو





ناوچانە زۆرە کە گەرمەو ئارەقەکردنی تیدا زورە و ئاو کەم دەخوریتەوە.

١) ئەوانەی کە بەردی گورچیلەیان نیە: ئەوانە دەتوانن بەرۆژوو ببن، وە بەرۆژوو بوون بە خۆپاراستن دادەنرێ لە دروست بوونی بەردی گورچیلە، چونکە:

a) ریژەی توخمی سۆدیوم NA+ لە لەش زیاد دەکات.

b) دەبێتە هۆی دەردانی جۆرە هورمونیک کە پێی دەووتریت هۆرمونی (ADH) بەم جۆرە ئەوانە دەتوانن بەرۆژوو ببن وە هیچ مەترسیان بۆ دروست ناکات.

٢) ئەوانەی کە بەردی گورچیلەیان هەیە: ئەوانەی بەردی گورچیلەیان هەیە و هیچ ماکێکی لەسەر تاکەکە دروست نەکردووە دەتوانن بەرۆژوو ببن بەلام تەنیا لە رۆژووی زۆرکەمدا با بەرۆژوو نەبن چونکە لە ئەنجامی ووشک بوونەوە حالەتی نارەحەت دەبیت، هەرچی ئەوانەن کە لەگەڵ بەردی گورچیلە ئالۆسکەکانی بەردی گورچیلەیان هەیە وەک هەوکردنی حەوزی گورچیلە یان گیرانی بوری میز ئەوانە دەبێ بەرۆژوو نەبن چونکە کاردانەوەی خراپیان لەسەر تەندروستی دەبێت.

a. ئاو و شلەمەنی زۆر بخورەوە لە پارشیو بەربانگ

b. دووربن لەبەر گەرما و کەشی گەرم

c. دوور کەوتنەوە لەخۆ هیلاکردن و ماندووبوون

d. گۆشت کەم بخوری

e. ئەو خواردنانەی کە ئۆگزالاتیان تیدایە وەک چوکلیت و چایی و سلق و سپیناغ نەخوریت

د/ نەخۆشی (داء الملوک) :خویی ترشی یوریک بە دیراسەکردن دەرکەوتووە کە خویی ترشی یۆریک لە دوو هەفتەی یەکەم کەم دەکات وە لە دوو هەفتەی دووەم کەمیک زیاد دەکات، وە لەگەڵ ئەوەش هیچ حالەتیک (داء الملوک) لە رەمەزان تومار نەکراوە و بەلکو رۆژووی رەمەزان نایەڵی تووشی ئەم نەخۆشییە ببن.

**ڕێنمایی**:

١.ئاو و شەربەت و شلەمەنی زۆر بخوریتەوە.

٢. گۆشت و پاقلەمەنی کەم بخوری

٣. میوەجات زۆر بخوری

٤. ماددەی پروتین کەمتر بخوریت.

# ڕۆژووی ڕەمەزان و ئافرەت

ئا: پزیشک

ئافرەت لە دووكات دا ڕێگای پێدراوە بە ڕوژوو نەبێت، ئەوانیش:

**- لەکاتی دووگیانی و شیردانندا، ئەگەر پێشبینی ئەوەی دەکرا بەبەڕۆژووبوونەکە زەرەر بە کۆرپەکەی دەگەیەنێت.**

**- لەکاتی بێنوێژیدا(سووڕی مانگانە)**

هەموو ئافرەتێک تەمەنی گەیشت هەژدەساڵ و هیچ نەخۆشیەکی نەبێت و ئەو دووبارەی سەرەوەی نەبێت دەبێت بەڕۆژوو بێت.

• ئایا ئافرەتی دووگیان دەتوانێ بەڕۆژوو بێ و ئەگەر بەڕۆژوو بوو،ئایا هیچ کارێکی خراپ لەسەر تەندروستی دووگیانەکەو کۆرپەکەدا هەیە؟

لەگەڵ هەموو ئەو گۆڕانە فەسلەجی و کیمیاوییەی کە لە خوێنی بەڕۆژوو بوودا ڕوودەدات، بەڵام هیچ کاردانەوەیەکی خراپی لەسەر تەندروستی ئافرەتی دووگیان و کۆرپەکەی دانابێت و ئەو ئافرەتەی باری تەندروستی تەواوەو دووگیانەو هیچ نەخۆشیەکی نییە، دەتوانێ بەڕۆژوو بێ، لەمانگی رەمەزاندا





ڕێژەی شەکر لەناو خوێندا دادەبەزێ و ئەم دابەزینە لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە لە زۆرکاتدا ڕێگای بە هەندێ ئافرەتی دووگیان دەدرێ بەرۆژوو بن و لەهەمانکاتدا ڕێگا بەهەندێ ئافرەتی دووگیانی تر نادرێ بەڕۆژووبن جا بڕیاردان لەسەر ئەوەی کامە بەرۆژوو دەبن وە کامە بەڕۆژوو نابن دەگەڕێتەوە بۆ پزیشکی تایبەتمەند.

ڕێنمایی بۆ ئافرەتی دووگیان کە دەیەوێت بەڕۆژوو بێ ؟

- زوو بەربانگ بکەو بە دووجار بەربانگ بکە.
- هەتا دەکرێ ژەمی پارشێو دوابخە.
- خواردنی چەورو قورس و سوورکراوە زۆر مەخۆ، چونکە دڵ تێکهەڵاتن و غازاتت بۆ دروست دەکەن و دوور بکەوە لە خواردنی شیرینی(پاقلاوە).
- خورما یان قەسپ یان هەنجیر لەکاتی بەربانگ و پارشێو زۆر بەکاربهێنە، چونکە ئەوانە نایەڵن تووشی نارەواتی(الاءمساک) ببیت.
- شیرو بەرهەمەکانی شیر زۆر بخۆرەوە لەبەر ئەوەی ڕێژەیەکی چاک کالیسۆمیان تێدایە.

ئەگەر ئافرەتێکی دووگیان یان شیردەر بڕیاریدا هەر بەڕۆژوو بێ، هەرچەندە پزیشکان ڕێگایان پێنەدا بەڕۆژوو بێ، بەڵام ئەو هەر بەڕۆژوو بوو، ئەوا لەم بارانەی خوارەوە کۆتایی بەڕۆژووەکەی بهێنێت :

- سەر ئێشەیەکی زۆر توندی هەبوو.
- چاوی ڕەشکەو پیشکەی کرد
- بێ توانایی و لەش داهێزران

ڕۆژووەکەی کوتایی پێ بێنی و ڕاوێژی پزیشکی تایبەتمەند وەربگرێ.





ئافرەتی دووگیان کە نابیت بەڕوژووبین:
- ئافرەتی دووگیان کە فشاری خوینی سەرەوەی کەمتر بی لە ١٠٠ ملم جیوە کە دەبێتە هۆی هەست بە بوورانەوە کردن.
- ئەو ئافرەتانەی کە لەگەل دووگیانیدا لە سەرەتای سی مانگی یەکەم زۆر دەرشینەوە.
- ئەوانەی لەکاتی دووگیانیدا تووشی ژەهراویبوونی دووگیانی دەبن(تسمم الحمل)، کە تیایدا ئافرەتەکە فشاری خوینی زور بەرز دەبیتەوە و میزی پرۆتیناوی دەبیت و قاچ و دەستی دەپەنمی.
- ئافرەتی دووگیان تووشی دابەزینی شەکرە دەبیت.
ئافرەتی شیردەر : ئەگەر ئافرەت کورپەی هەبوو شیری خوی پیدەدا، بەڕۆژووبوون هیچ کاریگەری خراپی لەسەر شیری ئافرەتەکە نییە، بەلکو چەندیتی و جۆری شیرەکە هەروەک پیش مانگی ڕەمەزانە، دەبیت دایک و کورپەکە تەندروستیان باش بیت ئەوکاتە ئافرەتەکە بەڕوژوو بی، بەلام ئەگەر تەندروستی هەریەکیکیان مەترسی لیکرا ئەوا با بەڕۆژوو نەبێت و راویژی پزیشکی چارەسەر وەربگریت.
ڕینمایی بو ئەو ئافرەتانەی کە شیری خویان دەدەن بە کورپەکانیان و بەڕۆژوو دەبن:
_ گرنگی بە خوراکی ئافرەتەکە بدریت، لە بڕ و چۆنیەتی و چەندیتی خۆراک.
- ئاو شلەمەنی لە نیوان بەربانگ و پارشیو زور بخوریتەوە.
- ئەگەر دایکەکە بەڕۆژوو بوو ئەوا لەکاتی گەرمادا ئاو بە گویرەی پیویست بە کورپەکەی بدات.
- دایکەکە هولبدات لەنیوان بەربانگ و پارشیو زور شیر بدات بە کورپەکەی و ژمارەی شیرپیدانەکان لەو ماوەیەدا بیت باشترە.
- دایکی شیردەر ئەگەر هەستت بە هیلاکی و ماندوو بوون و بوورانەوە کرد، کوتایی بە روژووەکەت بینە.

# چاودێری ددان لەمانگی ڕەمەزان

د.مۆید ئەمین ئیبراهیم
پسپۆری چاندنی ددان وپاریزگاریکردنی ددانەکان



هەرلەگەل هاتنی مانگی ڕەمەزان کەمانگی بەرۆژووبوون وپەرستنە زۆرانێک لەئێمە گیروگرفتی بوونی بۆنی لەدەم دەبێت وهەموو کات یەک لەئەندامانی خێزانەکەی یان هاوپیشەی ئەوەی پێبلێت کە : بۆنێکی ناخۆشت لەدەم دێت ؟ یان تاکەکە بەخۆی هەست بەوبۆنە ناخۆشە دەکات کە ٩٠ ٪ هۆکارەکەی بەهۆی هەندێ نەخۆشی ددان یان پدو یان زمانەوە دەبێت بەهۆی خراپی یان خاوێننەکردنەوەی ددانەکان بەشێوەیەکی بەردەوام یان بەهۆی هەوکردنی پدوەکان چ بەشێوەی کاتی یان بەردەوام بێت هەروەها زمان زۆر کات چینێکی بەکتریای لەسەر دروستدەبێت کەبریتین لەو بەکتریایانەی کەبەشێوەیەکی ئاسایی لەناو دەم دەژین ودەبێتەهۆی پەیدابوونی ئەو گازانەی کەبۆنی ناخۆشی ناودەم دروستدەکەن وهۆکاری سەرەکی زۆربوونی ئەو بەکتریایانە بریتین لە گرنگی نەدان بەپاکوخاوێنی ددان وپدوەکان بەلام ئەوە مانی ئەوە نیە ئەوەی بۆنی ناودەمی بۆگەن بێت مانی ئەوەیە گرنگی نادات بەپاکوخاوێنی ددان وپدوەکان چونکە هۆکاری تریش هەیە بۆنموونە زمان بۆیە لەگەڵ هەر خاوێنکردنەوەوشووشتنی ددانەکان پێویستە زمانیش بەبەردەوامی خاوێنبکرێتەوە هەروەها بوونی تاخمی ددان لەناودەمدا بۆن دروستدەکات وەئەوانەی تووشی دەم ووشکبوونەوە دەبن بەهۆی کەمی لیکەوە لە لیکەرژێنەکان تووشی دەم بۆگەنبوون دەبن چارەسەرکردنی زۆر ئاسانە ئەویش بریتیە لەوەی کە گرنگی بەپاکوخاوێنی دەمودان کە بەشێکە لەخۆ پاکوخاوێن ڕاگرتن وە ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی پاکوخاوێنیە بەتایبەتی پاکوخاوێنی دەم وددانەکان بۆیە پێویستدەکات مرۆڤ خۆ ڕابهێنێت لەگەل هەموو دەست شووشتنێک گولمە ئاوێک بخاتە دەمیەوە وغەرغەرەی پێبکات وبەسیواک ددانەکانی خاوێن بکاتەوە بەتایبەتی لەکاتی لەخەوهەڵسان وچوون بۆناوخەلکی وگەڕانەوە بۆ ماڵەوە بەلەبەر چاو گرتنی ڕاستی ئەو فەرموودەیەی خوشەویست کەدەفەرموویت:(لولا ان اشق علی امتی لامرتهم بالسواک عند کل الصلاة ) .

## چۆنیەتی چارەسەرکردنی ناودەم وسووربوون لەبۆنی ناخۆشی ناودەم ؟

بەبەکارهێنانی فلچەومەعجونی تایبەتی ددان شووشتن دوای هەر خواردنێک و دوورکەوتنەوە لەخواردنی خۆراکی چەور بەتایبەتی ئەوخۆراکانەی کەلەوانەیە پاشماوەکانیان بەددانەکانەوە بنوسێت ئاسانکاری بۆ گەشەکردن وزۆربوونی بەکتریا دروستبکەن، باشترین فلچەی ددان شووشتن کە پزیشکانی ددان لەسەری کۆکن بریتین لەو فلچانەی کەداوەکانیان نەرمە نەک ئەوانەی کەداوی ڕەقیان هەیە بەتووندی بەکارهێنانی لەوانەیە بریندار‌بوون وداڕووشانی پدوەکان دروستبکات واباشترە سەری فلچەکە بچووک بێت تا بۆهەموو جێگایەکی ناودەم بچێت هەموو کەلوبەرەکانی پێخاوێنبکرێتەوە یان مرۆڤ دەتوانێت دەزووی تایبەتی ددان خاوێنکردنەوە بەکاربێنێت ئێستا لە زۆربەی دەرمانخانەکان دەست دەکەوێت بۆ خاوێن کردنەوەی نێوان ددانەکان وەهەر فلچەیەک بۆماوەی سێ مانگ بەکاربێت، زۆر ئاو خواردنەوەوبەئاوغەرغەرەکردن چونکە ئاو پاشماوەی خۆراک خاوێن دەکەنەوە هەروەها ئاو شلە گازدارەکان ناهێڵێت وە پاشماوەی شەربەتی میوە کە جۆرە ترشی تیدایە کە بۆمینای ددان خراپە ناهێڵێت وە گرنگی دان بە خاوێنکردنەوەی دەم و ددان سێ ژەمە، سەردانیکردنی پزیشک ددان ساڵی دووجار بۆ خۆنیشاندان و پشکنینی ددان ئەمانە هۆکار دەبن کە ددانەکان هەتا هەتایی ساغ و سەلامەت بن .

گرنگی دان بە دەم و ددان گرنگی زۆری هەیە لە خۆپاراستن لە نەخۆشیەکانی دڵ و موولووله خوێنەکان ونورەی دەماغ، پزیشکان ئەوەیان بۆ ڕوون بۆتەوە ئەوانەی ئەو بەکترییانەیان هەیەکە بۆنی بۆگەنی ناودەم دروست دەکەن ئەگەری ڕەق بوونی خوێنبەرەکانی دڵیان زۆرە هەروەها پزیشکان ئەوەیان بۆ ڕوون بوتەوە کە پەیوەندی لەنێوان بۆنی بۆگەنی ناودەم لەگەل ڕەق بوونی خوێنبەرەکان تەنیا لە نیوان ئەو بەکتریایەیە کە بۆنی بۆگەنی ناودەم دروست دەکات و لەگەل بەکتریاکانیتر هیچ پەیوەندیان بەیەکتری نیە.

لێکۆلینەوەکان لە بەشی پاراستنی تەندروستی لە کۆلیژی پزیشکی لە سەنتەری میلمان لە زانکۆی کۆلۆمبیا بووە هۆی ئەوەی کە کە لیدوانی وا لەسەر پەیوەندی نێوان نەخۆشیەکانی پدو نەخۆشیەکانی دڵ گەیشتنە ئەو ڕاستیەی کە نەخۆشیەکانی پدو لەوانەیە هۆکاربن لە تووش بوون بە نەخۆشیەکانی دڵ لەبەر ئەوەی دەتوانرێت خۆ بپارێزێت لە نەخۆشیەکانی پدو بۆیە گرنگی دان بە خاوێنی ناودەم کاردانەوەی ڕاستەوخۆ و گرنگی لەسەر تەندروستی موولووله خوێنەکان دەبێت .

لەکۆتاییدا لەو مانگە پیرۆزەدا هانی خەڵک بدرێت کە گرنگی بە خاوێنی دەم و ددان بدرێت بە تایبەتی لە پاشیو و بەربانگ وە لەکاتی بەرۆژوو بوون دەم و ددان خاوێن بکرێتەوە بەمەرجێک ئاو قووت نەدرێت لەبەرئەوەی بەرۆژوو بوو تووشی ووشکبوونەوەی کەم دەبێت دەبێتە هۆی کەمی ڕژانی لیکەکان و گەشەکردنی بەکتریا و مانەوەی پاشماوەی خۆراک تووش بوونی ددانەکان هەوکردنی پدو بۆیە پیویست دەکات لەرۆژیکدا ئەگەر هەرنەبێت گۆلمە ئاوێک بخەیتە ناو دەم غەرغەرەی پێبکەیت.



## تعلم الطريقة الصحيحة لتفريش الأسنان



تفريش الأسنان الأمامية
من الداخل



تفريش الأسنان الخلفية
(الأسطح الطاحنة)



تفريش الأسنان الخلفية
من الداخل



لا تنسى تمرير الفرشاة
على اللسان



تفريش الأسنان الأمامية
من الأمام

**سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان**



**ژمارە: (٢٧٨)**
**رۆژ: ١٦ / ٦ / ٢٠١٠**

---

## تۆماری یاسایی

بەپێی برگەکانی (1، 2، 3، 4، 5، 6) لە ماددەی (3)ی یاسای رۆژنامەگەریی لەکوردستان ژمارە (35)ی ساڵی 2007 کە لە 2008/9/22 بڕیاری لەسەر درا، پاش ئەوەی کە دەرکەوت رۆژنامە/ گۆڤاری ( پزیشك ) کە خاوەن ئیمتیازی ( ئازاد سعدی سعید ) و سەرنووسەرەکەی ( ئازاد سعدی سعید )، مەرجە یاساییەکانی تێدا بەدیهاتووە، لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان بە ژمارە متمانەی ( ٢٧٨ ) تۆمار کرا..



فەرهاد عەونی
نەقیبی رۆژنامەنووسانی کوردستان
هەولێر ١٦/ ٦ / ٢٠١٠